# هەورە بچکۆلەکە



لە ئاسمانی پرشنگدار، هەورێکی بچکولە دەرکەوت. هەورەکە بە خۆیشی نەیدەزانی چۆن ئەمەی بەسەر هاتووە کەوا لە حەلحەلەی ئاسماندا بەو شێوەیە بە تاقی تەنها ماوەتەوە. هەورە بچکۆلەکە بە نائارامییەکەوە، تەماشای ئەملاو ئەولای خۆیی دەکرد؛ جارێکیان بەرەو بەرزی ئاسمان هەڵدەکشا، جارێکیش ڕووی بەرەو لایەکی تر دەبرد تا لە دواییدا، لە بەر تەنهایی و ماندبوون، خەم و پەژارە دایگرت.

ئەوجا هەورە چکۆلەکە، بڕیاری دا لە شوێنێکدا دابەزێ و پشووبداتەوە؛ گەیشتە باخچەیەکی ئاژەڵان، لەسەریدا لەنگەری گرت و دەیویست لەناویدا، دابەزێت، بەڵام کاتێ ڕاستەوخۆ دەنگی

کیژۆڵەیەکی بچکۆلای بیست: هەورە بچکۆلەکە، هەورە بچکۆلەکە، تکات لێ دەکەم، درێژە بە ڕێگاکەت بدە، من کراسێکی نوێم لەبەرە، بەڵام ساقۆم پێ نییە...

هەورە بچکۆلەکە، داوای لێبوردن لە کیژۆلەکە کردو درێژەی بە ڕێگاکەی دا. ئەم جارەیان گەیشتە سەر ماڵی خانزادی دایەپیرە کە لەم کاتەدا، لە سەربانی ماڵەکەی خەریك دروستکردنی نانی ساجی بوو. (خانزاد)یش پێی وت: هەورە بچکۆلەکە، تکایە دایمەگرە، با نان ساچییەکانم، تەڕ نەبن.

هەورە بچکۆلەکە بزەیی بە دایەپیرە هات و ئەم جارەشیان، ملی ڕێگاکەی گرتەبەر.

هەرورە بچکۆلەکە، ماوەیەکی درێژ بۆ شوێنێکی هێمن گەڕا، تا ئیتر دابەزێت و پشوو بداتەوە. ئەم جارەیان لەسەر باخچەیەکی ساوایان ڕاوەستا، ڕێك لەسەر تەختی شانۆگەرییەکەیان؛ دەیبینی چۆن منداڵەکان تەماشای هەڵپەڕکێیەکی گەرمی برادەرەکانیان دەکەن. منداڵەکان هەموویان بە یەك دەنگ وتیان: هەورە بچوکە خۆشەویستەکە، تکایە چاکەیەکمان لە گەڵدا بکە، لێرە دایمەگرە، دەنا هەموو شانۆکەمان تەڕ دەبێ، ئای گەر بزانی ئەوە چەند وەڕسمان دەکا.

هەورە بچکۆلەکە، هەناسەی ساردی هەڵکێشا و، چونکە بەڕاستی شەکەت ببوو، بەڵام نەیدەویست کەس خەمناك بکات، بۆیە دوا هێزی بە بەرخۆی دا و گەوتەڕێ.

ئەمجارەیان بەسەر شاری یەریڤانەوە تێپەڕی تا گەیشتە سەر دۆڵێك. لەوێ، زۆر بە سەرسوڕمانێکەوە، دەبینێ لەناوەڕاستی دۆڵەکە، تاقە دارە زەیتونێکی نەمام هەیە. دارەکە زیتونەکە لەوێ سەوز ببوو و وەك هەورە بچکۆلەکە، تەنها بوو و هەر وەك هەورکە، لەبەر گەرمایی و تەنهاییدا، حاڵی پەرێشان بوو؛ گەرماییەکە کاری تێکردبوو و خەریك بوو لە تینوێتییەوە، ووشك ببێتەوە.

بە هیوایەکی گەرەوە سەیری ئاسمانی دەکرد. خۆزگا بتانزانیبا، چۆن خۆشحاڵ بوو، کاتێ هەورە بچکۆلەکەی بینی یەکسەر بە دەنگێکی بەرز بانگی کرد: هەورە بچکۆلەکە، وەرە بۆ لای من، وەرە ئێرە، من دەمێکە چاوەڕوانی تۆ دەکەم!

هەورە بچکۆلەکە بەسەر دارە زەیتونەکە دایگرت؛ یەکتریان لە ئامێز گرت؛ هەردووکیان، بەختەوەر بوون.

نووسەر: ئەگاسی ئەیواسیان

وێنەکێشان: ئاشوت باجاندور

لە ڕووسییەوە: تیا-ماریانا بۆبرۆڤسکی

لە ئەلمانییەوە بۆ کوردی: سەلام عەبدوڵا

